ناوی کتێب: مامـۆستـا ئـەڵـێ
بەرگ: بەرگی یەکەم
نووسەر: د.نوزاد یحـیی باجگـر
دیزاینەر: سمیە مرادی
بڵاوکراوەی: زانکـۆی جیهان/ جیهان پرێس28
چـاپ: چاپی یەکەم (2021) هەولێر

بۆ داونلۆدکردنی ئەم کتێبانە بە بێ بەرانبەر لەم ماڵپەرانە دەست ئەکەوێت

www.nawzadbajger.org
www.nawzadbajger.net
chairman@cihanuniversity.edu.iq

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان | وەزارەتی رۆشنبیری
ژمارەی سپاردنی(196)ی ساڵی (2017)ی دراوەتێ



زانكۆی جیهان
جامعة جيهان
CIHAN UNIVERSITY
سوپاسنامە
* بۆ رۆحی دایكم.. و.. باوكم
* و خێزانم.. منداڵەكانم.. نەوەكانم
* و بۆ هەموو عاشقان.. هەمووچەشن
د. نەوزاد باجەلان
٢٠٢٠/١٢/١٥
www.cihanuniversity.edu.iq

# د. نەوزاد یحیـی باجـکـر .. لە ئەرشیفی بیـرەوەریمـدا

د. وریـا عمـر امـین

من زۆر لە نزیکەوە د. نەوزاد دەناسم ، چ وەك هاوڕێییەکی دێرین ، چ وەك خزمێکی نزیك.
د. نەوزاد لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە یێکێ بوو لەو ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆستانە کە خولیای خوێندنەوە و نووسینی کوردی و کوردایەتی بوون..خۆشی لە شیعرێکیدا بە بۆنەی مردنی ( سامی شۆڕش ) ـەوە باسی ئەو ڕۆژانەی خۆی دەکات و دەڵێ:

سامی ..ئەی شۆڕش
بحەسێوە...بحەسێوە...بحەسێوە
لە سکونی موتلەقدا
لە یادمە ١٩٦٥
لە گازینۆی سیروان لە بن قەڵا
گەنجان ... دۆمینە و تاوڵە
ئێمەش کوردایەتی ئازارمان بوو
ملاکی چای ناو پیاڵە
ئاوازی ئەی ڕەقیبمان بوو
کوردستان لە هەولێرەوە پێڕەومان بوو
....
هەر ئەڕۆین .. ئەڕۆین .. ئەڕۆین
ڕێگامان مەرگمانە
درووستکردنی ئاوەدانیی کوردستانمانە

وا بوو لە کولێژی پزیشکیی زانکۆی مووسڵ وەرگیرا و لە ساڵی ١٩٧٤ بوو بە پزیشك ... بەمە نەختێ لە بوار دابڕا بەڵام وازی لێ نەهێنا. پەیوەندی و عیشقی بۆ ڕۆشنبیری و وشەی کوردی بەردەوام بوو.. لە ساڵی ١٩٨٧ خوێندنی باڵای لە زانکۆی بەغداد تەواوکرد و بوو بە پسپۆر لە نەشتەرگەریی دڵدا کە لە بوارە هەرە زەحمەت و سەخت و ترسناکەکانی نەشتەرگەرییە ...ماوەیێك لە بەغداد خەریکی پزیشکییاتی بوو ..پاشان گەڕایەوە هەولێر و ڕووی کردە کارکردن لەگەڵ براکانی.

د. نەوزاد یێکێکە لە خێرخوازە دڵفراوانە پەخشندە هەرە چالاکەکانی کوردستان و شاری هەولێر .. کوردپەروەرێکی جەرگسۆز و دڵسۆزە ..عیشقی بۆ زانست و ڕۆشنبیری و خزمەتکردن و ئاوەدانکردنی کوردستان وای لێ کردووە توانینە ئابوورییەکەی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵ تەرخان بکات و چەند دەزگاییێکی خزمەتگوزاری دامەزرێنێ .. دیارترینی ئەمانە زانکۆی جیهانە لە شاری هەولێر ، پاشان لە سلێمانی و دهۆکدا..

زانکۆی جیهان گەورترین و پێشکەوتووترین و شەکاوەترین زانکۆکانی جیهانی سێیەمە..تەلارێکی زانستیی بەرزی سەرکەشە.. گەورەترین ڕۆڵ دەگێڕێ لە بڵاوکردنەوە و بووژانەوە و پتەوکردنی ئاستی زانستی و ڕۆشنبیری و وشیاریی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا..

د. نەوزاد وەك من بیناسم مرۆڤێكی لە ڕادەبەدەر چالاك و بە توانینە..مێشكێكێكی دینامێكیی هەیە لە ئەنجامدانی كارەكانی..دەیان دەزگای گەورە بەڕێوە دەبات...ئاگادارم ڕۆژێ بە لای كەمی ١٢ سەعات بێ وەستان كار دەكات و بێ ئەوەی هیچ هیلاكبوونێكی پێوە دیار بێ.. سەرەڕای ئەم هەموو بێ كاتی و سەرقاڵییە لە ڕادە بەدەرەی موچڕكی هونەر و شیعر و ڕۆشنبیری بەری نەداوە و بەردەوام بە گیانیا دەگەڕێ.. كتێبخانەیێكی گەورەی كتێبە كوردییەكانی لە ماڵەوە پێكهێناوە كە بە سەدان بەڵگەنامە و دەسنووسی بە نرخ و دەگمەنی تێدایە... مۆزەخانەی ماڵی فۆلكلۆری كوردەواری و سەنتەری ڕۆشنبیری و دەزگای بڵاوكردنەوە و سەنتەری بەڵگەنامەكانی مێژووی كوردی دامەزراندووە.ئیزگە و كەناڵی تەلەفزیۆنی كوردیی تایبەتیی خۆی هەیە..چالاكەوانێكی ژینگەییە ، بە هەزاران نەمام و گوڵ و درەختی لە چیمەنەكانی زانكۆكە و شوێنی تردا ڕواندووە ..و گەلێ جموجۆڵی تری ڕۆشنبیری و زانستی و كۆمەڵایەتی و پەروەردەیی. دەستی یارمەتی درێژدەكات بۆ هەر كارێكی ڕۆشنبیری و پشتگیریی دەكات.. لە ڕاستیدا ئەوەی د. نەوزاد بۆ بواری زانست و ڕۆشنبیریی كوردیی كردووە كەموێنەیە . لەگەڵ ئەمەشدا بەردەوام دەخوێنێتەوە و شیعر دەنووسێ و تابلۆ دەنەخشێنێ . تا ئیستا ٦ بەرگی بڵاو كردۆتەوە بە دەرهێنانێكی جوان و چاپێكی قەشەنگ و ڕازێنراو بە تابلۆكانی خۆی. لەگەڵ ئەلبۆمێكی گەورەی تابلۆكانی دەركردووە... شایانی باسە كە هەندێ لە تابلۆكانی بیردەربڕی سەرنجڕاكێشن.

سەبارەت بە شیعرەكانی ، د. نەوزاد بە زمانی كوردی و عەرەبی دەنووسێ ..زۆربەی بابەتەكانی لەبارەی خۆشەویستیی نیشتمان و پرسی ژیان و بوون و مردنە. ئەم شێوازە شیعرییەی د. نەوزاد لە ئەدەبی جیهانیدا باوە و بە Telegramic Poetry (شیعری برووسكەیی) ناودەبرێ.. تێیدا بە یەكدوو دێڕ بە لادانی زمانی و لۆژیكی و دەربڕینی لیڵ و نامۆ سەرنج ڕادەكێشێ. ئەم جۆرە نووسینە لە ئەدەبی كوردیدا بەرچاو ناكەوێ ... شیعرەكانی د.نەوزاد سەر بەم (ژانرەن). سۆز و ناسكی و بیری وردیان لێ بەدی دەكرێ. ئەمە لە لایێك ..لە لایێكی ترەوە شیعرەكانی د. نەوزاد سەرنجێكی زۆری ڕاكێشاوە و زۆر كەس بە دوایا دەگەڕێ .. بە (پێوانەی جیهانی) ش ئاستی هەر شتێك لە هەر بوارێكدا بە پێی ڕێژەی داواكردنیەتی. بە چ پێوانەیێك ئاستی گۆرانییێك یا فیلم یا شانۆ یا كتێبێك هەڵدەسەنگرێت؟ وەڵامەكەی لەوەدایە بە ژمارەی داواكردن و ڕوو تێكردنیان... گەر لەم ڕوانگەیەوە سەیری شیعرەكانی د. نەوزاد بكەین دەبینین ژمارەیێكی یەكجار زۆر خوێنەر بە پەرۆشەوە لێیان دەگەڕێن ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا هێما و پێوانەیە.

د. نەوزاد گەلێ دەربڕین و وێنەی شیعریی سەرنجڕاكێشی هەیە كە مایەی تێڕامانن و دەچنە بواری جەدەلییەتەوە ..بە تایبەتیی ئەوانەی لەبارەی پرسی فەلسەفیی ژیان و مردنن .. و هەندێ دربڕینی بوێرانەشی هەیە لە بارەی بوون و كردگار كە لە كۆمەڵە شیعرییەكانی (فی اللّه) و (الموت) دا بەرچاو دەكەون. لەوانەی ئیستا لە بیرمە ، كە لە شیعرە عەرەبییەكانییەوە وەرگیراوە:

ئەمەوێ مردن لە مردن تێركەم<br>
تا مردن تێر بێ لە مردن

***

ساڵەها هەوڵم دا وێنەیێك بكێشم واتای نەبێ نەمتوانی

***

پەیژەكانی سەركەوتن بەرەو بێ پایانی<br>
لەوێوە پایانی دەست پێ دەكات

د. وریا عمر امین

# مامۆستائەڵێ

یان مامۆستا دبێژیت... چ دبێژیت، هەتا نە چییە د ناڤ کەسایەتییا مرۆڤیدا باش فێرنابییە ئەلفوبێیا نیشتمان پەروەرییێ د گێرانا ئاخێ مامۆستا د ئەڤان بەرگاندا دبێژیت ب ستایلەکێ تازە و ب شێوازەکێ شیعری و ب سەلیقەکا زێدە جوان و ب زمانەکێ سادە و ساکار د هەمی ئەڤان پەندێن خوەدا مە دکێشیتە ڤیانا وەلاتی و ڤیانا مرۆڤان، لەورا ب هەستەکێ نیشتمان پەروەری وانەیێن خوە دبێژیت، نە شاعرم نە هونەرمەندم لێ خواندنا من بۆ ئەڤان پەندان مامۆستا هەم شاعیرە و هەم هونەرمەند، بەلکو زێدەتر زانا و ژێهاتی و مێشك دەولەمەندە، جاران مامۆستا وانەیان دبێژیت و جاران وەفادارییا خوە بۆ کەس و کار و عەردێ لێ مەزن بووی، هەڤلێرێ دکەتە ئارمانج و بەردەوام د لێگەریانێدایە بۆ روناهییەکا ئەبەدی، ئەوژی نیشتمان و سەربەخۆیا وەلاتییە، ل ئەڤێرێ جهێ ئاماژێیە بێژین، کو مرۆڤە یێ ئەڤان شیانێن دارایی و بەرنیاسی کو دەولەمەند و پزیشك ب ئەڤی ڕەنگی مال و ملکێ خوە بکەتە د خزمەتا گەل و مللەتی دا، وەکو شاعێرەکێ ژێهاتی و رەوشەنبیرەکێ مەزن و هەر کەسێ بۆ جارا ئێکێ شعرێن دیوانا مامۆستای (ئەڵێ) بخوینیت دێ وەسا هزر کەت زێدە د سادەنە، لێ ب دیتنا من ژ کویراتییا دلی دەردکەڤن، ژ حەزەکا مەزنا ئاخ و وەلاتی دەردکەڤن.
ل ئەڤێرێ دکتۆر (نوزاد یحیی باجگر ) چەندین پەیام ئێن مەزن هەم وەکو هەلویست و هەم وەکو ئامۆژگاری بۆ کەسانێن نیشتمان پەروەر بۆ ئەڤی نەوەیێ تازە کو بزانن ئەڤ سەربەخۆیە و ئەڤ ئارامییە و ئەڤ ئالایە ژ ئەنجامێ شورەش و بەرخودانێ هاتینە.
پەیڤێن شرینێن دکتۆری بکارهینانەکا هونەرییا بلند، هەمی دەربرینێ ژ ڕاستییێ دکەن، نەخاسمە دەمێ دبێژیت:

ڕاستی..... بڵێ

ئەگەر........ بشمری

بەلێ، مامۆێیاڤاهییێ خوە ل سەر ڕاستییێ ئاڤاکرییە، دیسا هەتا مرۆڤ نێزیك نەبیت مرۆڤ نازانیت کو چ ئالی نەماینە دکتۆری ئیشارەت پێ نەدای، هەمی ژی دکەڤنە د چارچوڤێ زانین و زانست و پەروەردێدا و دبێژیت: (خوێندن بەنرخە) بەلێ مامۆستا، هەر چییا تە د ئەڤێ دیوانێدا گوتی یا ب نرخ و بهایە و ئامۆژگارییێن ب بهانە، ئەز دبینم هەر بەیتەکا شعرێ کەڤالەکێ جوانە و یێ کاریگەرە و ژ هەژییە ل هەمی ژورێن قوتابخانا و مالان بهێنە هەلاویستن، تێر بژین و تێر تەمەن بن.

پرۆفیسۆر دکتۆر
ئیبراهیم ئەحمەد سمۆ

# خوێنەری خۆشەویست ..

ئەو کۆبەرهەمەی بەر دەستت (مامۆستا ئەڵێ)، بەرهەمی هزر و بیری (د. نەوزاد یەحیا باجگر)ە، لە شێوە و ناوەرۆکی شیعری ئازاددا گوزارشتییان لێ کراوە. ئەم شیعرانە دەچێتە نێو خانەی برووسکە شیعرە یا (شیعری برووسکەیی Telegramic Poetry یا وێنەی شیعری ، شیعری وێنەیی سەرنج ڕاکێش . هۆکاری سەرنج ڕاکێشی شیعرەکان بۆ گەڵێك هۆ دەگەڕێتەوە، بەکورتی بەم شێوەیە شرۆڤەیان دەکەین.

ئەم کۆبەرهەمە شیعرییە (مامۆستا ئەڵێ)، دوای ئەزموونی شیعری (فی اللە، الموت، کوردستان، پێشمەرگە، وشە دەچێنم، أزرع الکلمات، زنجیرە پەرتوکی کودستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانی دا) دێت، بریتییە لە چەندین بەرگ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بەرهەمی تێڕامانی هزرن لە بواری فەلسەفەی بیری مرۆڤایەتی و لە تێگەیاندنی بەرامبەر لە پەیامی هزردا بۆ بنیاتنانی مرۆڤ و نەشونوماکردنی وەرگر، ئەوەیان لەناوەڕۆکدا.

لە ڕوخساریشدا شیعرەکان گرنگ نین سەر بە چ ژانرێك بن، لای ئەوی شاعیر شێواز خۆیەتی و شوین پێی کەسی پێوە دیار نییە و لە کەس ناچێ خۆی نەبێ، هەروەك ڕەخنەگری فەرەنسی (جۆرج بۆفۆن) گوتەنی: مرۆڤ خۆی شێوازە. لەم شیعرانە و سەرجەم شیعرەکانی (د. نەوزاد) دا هەست بەو بۆچوونە ڕەخنەییەی شێوازی هونەری گوزارشتکردن دەکەین.

لەکاتێکدا لە ئەدەبیاتی مرۆڤایەتیدا نموونەی شیعری (جاك بریفەر وواڵت ویتمان و شیعری هایکۆی یابانی) و لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردیشدا شیعری چوارینە و پۆستەرە شیعر و برووسکە شیعر سەر بەو ژانرەن کە (د. نە وزاد یەحیا باجگر) شیعرەکانی بەلادانی زمان و دەربڕینی لێڵ لە هەندێ گوزارشتدا سۆزو ناسکییەکی دیکەی بەخشیوە، سەرباری بوێری لە دەربڕین نووسیندا و نەهێشتنەوەیان بە ناکامی لە نێو ناخ و زاردا.

بوێـری و سـادەیی لـە دەربڕینـدا گـەر خاسـیەتی هونـەری شـیعری ئـەو بێـت، مەبەسـت لێـی لای خـودی د. نـەوزاد یەحیـا باجگـر چ لەشـیعرەکانی یـا تابلـۆ هونەرییەکانیـدا ئاسـوودە بوونـی نـاخ و بیـرە لـەو جەدەلییاتانـەی کـە هـەر دەبـێ گوزارشـتیان لـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم هەژانـەی نـاخ و هزریـش لـە مێـژە گوتویەتـی:

نە شاعیرم، نە هونەرمەند
مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

بەگشـتی ناوەڕۆکـی شـیعرەکانی (د. نـەوزاد) دەچێتـە نێـو بابەتـی خۆشەویسـتی مـرۆڤ بـۆ نیشـتیمان، بـۆ زانسـت و تێکۆشـان و بنیاتنانـی خـود و پێگەیشـتن لـە تێگەیشـتندا، پرسـی ژیـان و مـەرگ و مانـەوە لـە نەمرییـدا بـە کار و کـردەوەی چـاك، هـزری داهێنـەر و بنیاتنەرانـە، نابـێ ئـەوە لەبیـر کەیـن لای ئـەوی ئەفرێنـەر هەمـوو شـتەکان واتایـان هەیـە: ئەوەشـیان ترۆپکـی گەیشـتنی بـە مانایـە بـە مەبەسـت، سـەیرکەن چەنـد جـوان گوزارشـتی لـە بـێ مانایـی کـردووە:ـ ساڵەها هەوڵمـدا وێنەیـەك بکێشـم واتـای نەبـێ، نەمتوانـی.

د. محەمەد خدر مەولود
زانکۆی جیهان
هەولێر ٢١-١٢-٢٠١٦



# مامۆستا ئەڵێ

نە شاعیرم نە هونەرمەند
مێشکی خۆم دەکەم دەوڵەمەند

د.نوزاد یحیا سعید باجگر



# مامۆستا ئەڵێ

ویساڵی .. وەسڵتم
هەر ماوە
گەرمی ئاگری .. چاوەکانت
چل ساڵە .. لە دڵم
هێشتا گەرم ... ماوە

د.نوزاد یحیا سعید باجگر
24/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له .. تاریکی تاریکستان
له تەقینی ئەتۆم
تریشقەی بێ بروسك
تا .. بزانین ... تاریکی نیه
نەبوونی ڕوناکیه
له تیشکداری چاویه.

نوزاد یحیی سعید
10/8/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەتا ئەژین ... تێئەکۆشین
هەتا ئەمرین ... فێر ئەبین

د.نوزاد یحیا سعید باجگر
25/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

لێم ببورن ... ئەگەر هەموو شتم نەزانی بێ
لێم نەبوورن ... ئەگەر دەخیلیم کردبێ ...

د.نوزاد يحيا سعيد باجگر
25/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بێ کەس ... شێرکۆ بوو
شمشێر بوو
شێر بوو
شمشێر .. بوو
شیعر .. بوو
خۆزگەم .. بەخۆی
کورد .. بوو
ئێستا .. ئازاد بوو.

5/8/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لەگەڵ خۆتان ڕاست بن
وە لەگەڵ خە ونەکانی خۆتان

28/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ڕزگاریمان
تەنها .. بەکارهێنانی زانینە
بە هاوچەرخی ...

28/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ڕزگاریمان
بەکاری نەتەوایەتی نیە بەتەنیا
بەهاوکاریی وولاتانی ... دونیا

28/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ڕزگاریی وڵاتی جیۆپۆلیتیك
پاش ڕزگاریی هونەر .. و .. ڕەوشتە.

28/3/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

له زەردەشتەوه .. تا ...پێغەمبەر محمد (د)
مامۆستان.

28/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بەرگری .. بەرگریی تیرۆر
مونتاژی خۆیانە
بۆ حەواندنەوەی دارایی
پڕ بە پیستەیانە.

28/3/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مردن ... نیە لە مردندا
مردن ... لە کۆتایی ژین
بە لێبوردن.

28/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەختیاری ... ڕواندنی ڕووناکییە
بینینی ... سروشتە.

28/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عاشقی هەموو شتێك بە..
بەردەوام لە خۆشەویستیدا بە.

28/3/2013
هەولێر




بەڕێوەبەرایەتیی سیستەمی تازەی دونیا
لە کۆدی تەلەفۆن خێراتر ئەگۆڕێ.
نەخشەی نانۆ تەکنەلۆجی لە یەك دەچێت
سیستەم ئەناسرێ
وەك گۆڕینی جین لە DNA دا
چەشنێکی نوێ ئەڕوێنێ.

28/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دوو ژنی
واتا زوو مردنی

29/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بۆ تاقیکردنەوە ... و
بۆ فێر بوون بخوێنە.

29/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پشوودانی ... هاوین
بۆ مەشق و فێر بوونە.
نەك ... بۆ نووستن

29/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

هەر قوتابی ئەمێنم.

29/3/2013

هەولێر



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

سەختیی .. ژیان
فێر بوون زیاد دەکات.

29/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بەفری کوێستان
زانین گەش ئەکا

29/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ڕەشبینیـــت ..
بە خوێندن .. ڕووناك بكە.

29/3/2013



# مامـۆستا ئەڵێ

دەردی هەژاری گرانە
دەردی نەزانین ....
وەرەمە .. و .. نەساغیە.

31/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەرمانی نەزانین
زانینی زانستی ژینە

31/3/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

مل کەچی .. تەنیا ..
بۆ حەق .. و .. خودایە

31/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاك نالەرزی
خۆی ئەخورێنی
کەفوکوڵی لەشی دەرئەهێنی

31/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چوارچێوەی ... خۆر
تەقینەوەی ئەتۆمە بە تیشکی سۆر
زەمینیش بە سەهۆڵ بوونی ڕەنگی مۆر.

31/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوت دەروازەی بینینە
بینینیش مەلەوانگەی دەروونە
بینین .. و .. دەروون
ڕێگای زانینە.

31/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کات ... ڕاوێژکارتانە ... ژیانتانە
بە کاری بێنن بەژیری
ئەتان پارێزی .. لە پیری

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەی باشە وەریگرن
ئەوەی بەختیاریە بیپارێزن
ئەوەی خۆشەویستییە
بیدورنەوە

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوت هەڵمەتی مێشکتە
ئازارت هەڵوێستی ژانتە
هەڵوێستی هەڵمەت
ژانی ... مێشکتە.

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕێی ڕووناکیی تیشکی ڕۆژ بە ...
تاریکیی شەو
هەردوولای .. ڕووناکیە.

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دووری ... هەستە
لەناوتە ... بێ مەبەستە
لەدوورتە ... لەناوتە
ئەمەیە بەرژەوەندی.

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زامدارم ... لەبێ هەستیی ئێوە
عەبداڵی پەروەردگارم
لە پێناو .. خۆشەویستی .. ئێوە

1/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێن ... ئەوانەی ئەڵێن
(ئەڵێن) ی .. تێدا .. نیە.

3/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەڵێن ئەوانەی ئاوەدانی
دروست ئەکەن
دروستن
بەڵێ ... دروستن

3/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

له بەندیدا
چۆن بەختیار ئەبی
ئەگەر ... ببی
ئاخۆ ... چۆن ئەبێ !؟

3/4/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

ڕاستی ... بڵێ
ئەگەر .. بشمری

3/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کارەساتی ... جەنگ
دەربەدەریی بیرکردنی سەرکردایەتی
بێ بیرە ...

3/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

دەربەدەریی بیر
سەختترە لە بەڕەڵایی ژیر

3/4/2013
هەولێر



# مامـۆسـتا ئـەڵـێ

جەنگ .. گەنجە
گەنجیش ... ڕەنجە
ڕەنجیش ... خوێتی ڕژاو
بۆ دراو

3/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵـێ

خاك .. خاوێنە
خاوەنی ... خوێنە

3/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مردن ... ئای مردن
چەند خۆشی
بەڵام ... هەستی پێ ناکەین
ئێستا !

5/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## سەرسامی! ڕێگای دۆزینەوەی چارەسەرکردنە

5/4/2013

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

نەبوونیتان
مەخەنە سەر خودا
بۆ درووستکردنی  بوونتان
هەموو شتی پێ بەخشیون

5/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ژیان کورتە
زۆریش درێژە
تۆ ئەبێ پێوەرێ دروست بکەی.

5/4/2013
هەولێر



## مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

به .. تەمەن .. و.. سامان
نابینه مامۆستا
به فێرکردنی زانین .. و دروستکردنی
ئەبیە ... وەستا
بەخۆشەویستیی فێرکردن
ئەبیە .. مامۆستا.

5/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی باران بن
لەئاسمان ...
ئەگەر کەم بوو
ئاوەکەی هەڵگرن

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پێویستە ... تەنها بەتەمای
میوەی سروشت نەبین
ئەبێ ... بچێنین
چونکە هی سروشتی
بەشمان ناکات

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دوور ... بڕۆ
گەر .. ڕێگای کورت پێ نازانی

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەوڵەمەندی .. بەتەنیا
سامان نیە ...

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

یەك + یەك بۆ ئەبێتە دوو
دوو جار دوو ئەبیتە چوار
ئەگەر نەیزانی
سەرسامیە ... نیگەرانیە ؟!

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زانین .. بەبێ ئەوەی بزانی بۆ!
تۆمارکردنی ... بێ سوودییە.

8/4/2013



# مامـۆستا ئەڵێ

ئەوەی ئەیزانی
بزانە چۆن ؟.. بۆ ..؟

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئاگاداری ... بەکارهێنانی
زانینەکانت ... بە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەوەی ئەیڵێم
زۆربەتان ئەیزانن
بەڵام نایڵێن
ئەزانن بۆ ...
چونکە بیری لێ ناکەنەوە

8/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سوێند بە خودای گەورە ...
بە قوتابخانە ڕوخاوەکان
جوانتر .. چاکتر
دروستی .. بکەینەوە.

8/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئاهەنگ ... و ... مۆسیقا
سەربەستیی دەروونە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستی سنووری ... سنووری
سەربەستییەکانی ترە

8/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

هەمووتان .. مامۆستای منن
چونکە لە ئێوە فێر بووم و
فێر ئەبم.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لەکاتی ... تەنگانەدا
پێبکەنە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کۆمپیوتەر .. و .. ئینگلیزی
قەڵەم .. و .. دەفتەرن

8/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هێزی زانین و ڕاگەیاندنی
بەهێزترە ... لە وزەی ئەتۆم

8/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

هەناسەی مامۆستا
ڕەیحانە ...
گەیاندنی .. دەنگی .. مانە

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هونەر ... پێش زانستە
بیری یەکەمە ، دووەم
درووست ئەکا.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەربەخۆیی ... پێداویستییێکە
ئەبێ درووستی بکەین.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مەترسێن ... لە زاڵمان
ئەوان خۆیان لە خۆیان ئەترسن
خۆیان خۆیان ئەفەوتێنن

8/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

عەشق ...
هەوێنی ژیانە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ... پەنگرە
وەك ... زەمین
دەرەوەی خۆڵەمێشە
ناوەوەی ... ئاگرە

8/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

عەشق .. ئاوازی جوانییە
بەهرە و پاداشتی یەزدانییە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ... هەستی
سەروەری ژوور عەقڵە.

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عەشق ... مەشقی ویژدانە
هەڵوێستی ... کۆبوونەوەیە

8/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

وەستایی ... ئەوەیە
وەستا ... بمێنیت

10/4/2013
هەولێر




وەستا ... ڕەجەب
درووستکەری تۆپی پاشای کۆرەیە
ئەی .. کوان..
دروستکەرانی داس ... و ... جەنجەڕ
بۆچی ... نەمان
ئایا ... بارود بەقیمەتترە ... گرنگترە ... لە
گەنم ؟
هەڵەیە ... بیرمان !

10/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

هەتا ... هەتایێ
بەیداخی ... فاولمان
بەرز ئەکەم

10/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لەبیرم چوو
پێتان بڵێم
خۆتان ... لەبیر مەکەن
هەمووما‌ن .. خشت و کەرەستەی
بنیاتنانی ... وولاتین

10/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فەرمانی .. خودا
سەرووی فەرمانانە
ژیان بە جوانی
بپارێزن.

10/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پەرتوکەکان ... یا
ئەیان سوتێنن
یا ... ئەیانفرۆشین
خۆزگە ... بفرۆشرانە
دیارە ... به نرخن !

10/4/2013
هەولێر ـ مال



# مامۆستا ئەڵێ

پەرتوك ...
بەرد بوو
دار بوو
كاغەز بوو
ئێستا ...
ئەلیكترۆنە
بیزانن

**10/4/2013**
**هەولێر**



# مامـۆستا ئەڵێ

له ... مێروو ... له .. دار
لەبەرد ... لەئاو
له ... ئاسمان
فێر .. به

10/4/2013



# مامۆستا ئەڵێ

ئەو .. کاتەی کە ئەنووسم
خۆشەویستیی
موتلەقــ .. مە.

10/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئەو .. کاتەی فێرئەکەم
فێر .. ئەبم

10/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بەختیار .. بن
ئازاد .. بن
درووستکەر .. بن
مرۆڤـ .. بن
ئاگادار .. بن

10/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مامۆستا ... و ... قوتابی
پێویستە .. یاری .. زانین
بکەن

10/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

مامۆستایەتی شێوازی
کۆن .. و .. نوێ نیە
بەخشینی ... زانایيە

11/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستا وتاری گەیاندنی
ڕوناکی ژیان .. و .. دەروونە

11/4/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مامۆستایەتی
گەیاندنی زانین
و .. خۆشەویستیە

11/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ڕامەچەنێ .. لە تەنگانەدا
هێمن .. و.. دووربین بە

11/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەشەو .. برۆ بۆ دەریا
بە ڕۆژ .. برۆ بۆ فریا
ڕۆژ .. مەکە .. بە شەو

11/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کات .. و .. کات
هەندێك .. شێتایەتیی
بەکەڵکە

11/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خواردن ئەکرێ 2/3 ی ناخورێ
1/3 ی پێویستی ژیانە
ئەوی تر ... زەرەرە
بۆ ماڵ و کات .. و
تەندروستی.

12/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زانکۆ ... شانۆی زانینە
بۆ زانستی هاوچەرخ
پێویستە لەگەڵ زانکۆیەکانی دونیا
هاوسەنگ ... بین
یەك ماڵ بین

15/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵیّ

زانکۆکانی جیهان بەتەمەنی
پێنچ ساڵی ... بوونە هاوئاستی
زانکۆکانی جیهان
کە تەمەنیان سەدان ساڵە
بۆیە کوردستان ئەتوانیّ
ڕێگای دە ساڵ بە دە مانگ
ببڕیّ
چونکە پەیوەندیەکان زۆر خێران.

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

زانکۆ ... مەڵبەندی  زانین  و زانستە
ئەوەی  هەمانە ... نیانە
ئەوەی هەیانە ... نیمانە
بۆیە ئاڵ  و گۆڕ
لەبەرژەوەندیی هەموومانە

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

زانکۆ ... مزگەوتە
کڵێسەیە ..
پەرستگایە ..
پیرۆزە ...
چونکە
خودا .. بەزانست ئەناسرێت

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زانكۆی جیهان
مزگەوتمە ... گۆڕمە
ماڵمە ... ئاییندەمە.

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

زانکۆ ... تاقیگەی
ژیانە.

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

زانکۆ ... زاخی مەل بۆ بێچوویانە
زانکۆ ... زامی دیکتاتۆرانە
زانکۆ ... زەردەخەنەی  خۆشەویستانە

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئێوەش ... ببنە مامۆستا
بەڵێن.

15/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## زانکۆکانمان ... ئاو .. و .. باغمانن

15/4/2013

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

باخچەی ... ساوایان .. و .. سەرەتایی
گرنگترن ... لە زانکۆ

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

فێرکردن .. لەباخچەوە .. بۆ سەرەتایی
لە کوێ لاواز بێ .. لەوێ
ئەچەقێ

15/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فێرکاری ... پرۆسەی بەردەوامییە
لەکوێ لاواز .. بێ
لەوێ ئەپچڕێ

15/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فێرکردن ... هەڵمەتە
فێربوون .. زەحمەتە
زەحمەتی .. هەڵمەتی ئەوێ

15/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

فێربوون ... فێرکردن
دروستکردنیان
بە توێژینەوەی زانستە

15/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی .. خەڵات بی
مامۆستایەتیت پێناکرێ

16/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی بەرهەمی
چاندنی ئاسن بە

16/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئێمە ... ئاسن
ئەچێنین

16/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی سەربەستی مەبن
ئەگەر ئازاد نەبن

16/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... ئەمەکی
مۆمی .. ڕووناکی گۆڕە

16/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی ... خۆبەخشی
جوانترە لە بەهەشتی

16/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاوەڕوانی هێزی سامان
ئەتکات ... بە سەپان

16/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاو .. چاو .. چاوان
چاوەڕوانی ... خەرمان
بێ چاندن
بێ دوورینەوە
وەك چاوی .. نەبین

16/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فەرموودەی .. پێشینان
هەمووی .. ڕاست نیە

16/4/2013
هەولێر  مال



# مامـۆستا ئەڵێ

فەرموودەی .. فەرمانیان
فەرمانیان بەدیل گرتووە.

16/4/2013
هەولێر   مال



# مامـۆستا ئەڵێ

فەرمووودەیان .. بە سستی ئەگۆڕێ
بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین

16/4/2013



# مامۆستا ئەڵێ

چەند .. خودات
خۆشبوێ
سەد ئەوەندە
خۆشتی ئەوێ

16/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

یاسامان ... هەیە
بمانپارێزێ
بەڵام .. ئالیەتی نەچەسپاوە
لەناخمان .. و
لە ... دەزگاکانی یاسا.

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەموومان ... یاسا نەپارێزین
لێی سوودمەند نابین

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

یاسا ... قەڵغانمانە
ڕێزدارە ... دەبێ هەڵمەتی
بۆ بکەین

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زانستەکانی یاسا
پێویستە بخوێندرێ لە قوتابخانەی
سەرەتاییدا.

17/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

یاسا ... و ... ژیان
پێش ئەکەوێ ... چاکتر ئەبێ
بە چاکسازی
مێشك.

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

توو خودا ...با هەموومان
دادپەروەر .. و ... پارێزەری
یاسا ... بین

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

یاسا ... فەرهەنگی پەیامی
پەیوەندیی مرۆڤ .. و .. مرۆڤایەتی و
ژینگەیە.

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

یاسا .. وەك ئاو
ئاوەدانیە.

17/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئایین .. و .. یاسا
دوو لای ئاوێتەن.

17/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

میللەت چاك بێ
سەردارەكانیان باش ئەبن

19/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

میللەتی بە هیممەت
سەرۆکی زۆرداری
لێ نارِوێ

19/4/2013
هەولێر



## مامۆستا ئەڵێ

میللەتی .. تەمبەڵ
بە کۆشش و ڕاهێنان
بە دانانی ئامانج
هێدی .. هێدی فێر ئەبێ
بەڵام زۆری لەکیس دەچێ.

19/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

میللەتی .. شاخەوان
ئەبێتە باخەوان
لە باخەوانیەوە .. ئەبێتە شارستان
خەسڵەتی گورگایەتیی هەر ئەمێنێ.

19/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

شاخ ... مان ... مان بوو
دواکەوتنمان .. بوو

19/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئاومان زۆر بە فیڕۆدا
ئێستا ئەبێ بیبەستین

19/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

میللەتێکی گورگین
مەڕ نەبێ بیخۆین
یەکتر ئەخۆین
تا یەکتر نەخۆین
با کار ... بکەین
مەڕ بەخێو بکەین

19/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەرکەس خۆی دروست بکات
میللەت .. و .. وڵات دروست و بڵند ئەبن

19/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

میللەت ... خاوەنی خۆی بێ
وڵات .. هی ئێوەیە.

19/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئێمە ئاوەدانی کەین
خوداش .. ئەیپارێزێ

19/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵـێ

سوێند بە خودای گەورە ...
وەستایانی بنیاتنەرانی
قەڵای هەولێر
کوردستان .. ببێ
و بمێنێ.

19/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

قەسەم بە خودای گەورە ...
بە خوێنی شەهیدان
فێرکردنی ... نەوەی کوردستان
پیرۆز ... بێ.

19/4/2013



# مامۆستا ئەڵێ

هەموو هێزەکانی قین
ئازارتان .. زوو لەبیر ئەکەین.

19/4/2013




نانمان ... هەویرمان
ئاردی گەنمی قەراجە
شێلراوە .. بە ئاوی بەفری قەندیل
بە ئەنگوستی دایکی کوڕ بزر
ئەیشێلێ بە هێزی قەهری
خێدانی ئەکا بە فرمێسکی
ئەبرژێتی .. بە هەناسەی
چۆن .. قەدری نازانن ...؟
ئەی هاوار .. ئەی هاوار
هاوار .. هاوار
خودایە .. هاوار .. خودایە

19/4/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

ئەڵێم .. و.. ئەڵێم .. و.. ئەڵێم
هەتاکو .. لەگەڵم ئەڵێن

19/4/2013
دبی. مطار



# مامۆستا ئەڵێ

گەر خۆمان ... خۆمان نەخۆین ؟!
زۆر زوو گەورە ئەبین

22/4/2013
واشنتن ـ ماریوت هوتیل



# مامـۆستا ئەڵێ

زۆر دووره وولاتیان
نزیکه دەسەڵاتیان
هەموو شت له لایان
بۆ کڕین .. و .. فرۆشتنه.

22/4/2013



# مامۆستا ئەڵێ

ئەم شتەی نەفرۆشرێ
پێش ناکەوێ.

22/4/2013



## مامۆستا ئەڵێ

ئەم شتانەی .. تاقی دەکرێتەوە
دەپشکنرێن
ئەبێ قازانجی لە دوایی بێت.

22/4/2013



# مامـۆستـا ئـەڵێ

له .. زەمانی زەردەشتدا ژیام
ڕابووردومان ئاوێنەی داهاتوومانە
بۆ .. فکر ... ڕوناکی ناخ
دیارە .. بۆ هەمووماندە.

7/5/2013



# مامۆستا ئەڵێ

ئامانجی .. ئایین
ڕوناکییە .. بەختیارییە
بۆ هەموومان.

7/5/2013




حساب .. ئێمە درووستمان کرد
بۆ خۆشی ژیانمان
بۆ پێوەری پێویستمان
نیە .. لە ژینگە .. مەتر .. دەقیقە ..
لە پڕۆسەی ژیانەوە
پێوەر بە پڕۆسەی
کاردانەوەی زیندەوەری
هەتا .. ئێستا .. نیمانە پێوەرێك

7/5/2013

# مامۆستا ئەڵێ

پێوەر .. پێوەری لێ هەڵئەقوڵێ
گەز .. ذراع .. پێوەری باڵ
پێ .. قەدەم .. پێوەری پێ
مەتر .. یارد .. دوو چەشنی ئیمپریالیزم
شارستانی .. میزۆپۆتامیایە
فارس .. هیندۆس .. چین .. یۆنان
هەموو .. ڕووخان
لەژێر پاڵەپەستۆی
تەکنەلۆجیای .. هاوچەرخ
ئێوەش ...
ببنە خاوەنی .. فێری ببن.

7/5/2013



# مامۆستا ئەڵێ

هەموو .. ئەوەی هەیە
ژیانە ..
بەرد .. شاخ .. دەریا
ئاسمان .. هەموو .. هەموویان
ئەژین .. بەشێوەی جیاواز
بە .. یەك ئەساس.

7/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بتوانە .. بتوانە
ئەوە .. توانایە
توانا .. توانا
میکانیزمی .. دروستکردنانە.

7/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سەنگی .. هەموو خوڵقاو
سفرە ...

7/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

چاو .. جوانەکانم
جوانیتان .. ئاگری ناوەڕۆکی زەمینە
فڕینی .. ئاگر .. دووکەڵ .. تۆزی
ڤۆلکانی .. تەوازنی هێزەکانە.

7/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەڕاستی .. بگرن.. تەرازوو

7/5/2013

هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

ئێمە .. لەناومان ...
ئەمیبیامان .. ئەمانخۆن.
ئەمیبیامان .. دروستکەری
دوژمنانمان ... لە ستراتیژیەتی
دار .. کرمی خۆی بیخوا.

7/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

بەتەنیام لەناو خۆم.

7/5/2013

هەولێر



# مامــۆستــا ئـەڵـێ

مامۆستایەکانم .. هەندێکیان
مامۆستا .. نەبوون.

7/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەرمانی .. مامۆستایەتی
پەرێزی پاش دوورینەوەی.
خەڵاتە
بۆ مەڕوو ماڵاتە.

7/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەن .. زانین
و .. سامان
و .. کار .. بن.

9/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

خاوەن ... ڕەوشتی
خۆشەویستی
و .. سەربەستی .. بن.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## خاوەنی ... خۆتان بن

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەنی ... وڵات
دەسەڵات
خزمەت ... بن

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

## خاوەنی ... خۆشەویستی .. بن

9/5/2013

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەنی ... هەوێنی ماستی
سەربەستی
لە شیری خۆماڵی ... بە.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هیچ خاوەنی ... دوژمن
مەبە ...

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەفەر .. بکە
بۆ ... ناوخۆت و
بۆ ... دەرەوەی خۆت.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەنی .. زانست .. و .. زانین ..
و... بەخشینی ... خزمەتی
پەروەردگار بە.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خاوەنیەتی .. مامۆستایەتی
قورسترە .. لە بێ سەنگی.
سوکترە ... لە قورسایی زەمین.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەموو ... شتم
وەك خۆم بچووكە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بۆ .. مامۆستایان
خۆزگە ... وەك ئێوە
مامۆستا ... بوومایە.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستایان
هەمووتان لەمن باشترن
ئەگەر .. خۆتان بدۆزنەوە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئـەڵێ

بۆ مامۆستایان
خۆزگە ... بەختیاری
مامۆستایەتی
بدۆزنەوە
ئەبینە خاوەن شارستانی.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بۆ .. هەموو مامۆستایەکانم
وە .. مامۆستایەکان
پێتان ماچ ئەکەم
ئاگاداری قوتابیان بن.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

دەرمانمان
مامۆستایە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ترست نەبێ لە مردنی
زانین .. و .. زانست

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

هەرکەسێك ئەوەی بدەیێ
کە .. بە قیمەتی
سەربکەوێ.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەختیار .. بن
هۆشیار .. بن
هێمن .. بن.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کوردی فێربوونمان کوردایەتیە
زمان ... زانین ... ڕەوشت
خۆشەویستی کارە.
فێربوونمان
لە کوردایەتی .. کورد .. ترە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

پایە ... پایە
سەر ئەکەوم ...
ئەوانی تر ... بەهێزی سیاسەت.
قوتابییەکان .. بۆیە چوونە سیاسەت
تەرازوو .. ئینجا .. نەترازاوە

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

مامۆستا ... مۆدێلی
شارستانێتی .. زانینی
ووڵاتە.

9/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

قوتابی .. ئاوێنەی
مامۆستایە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئەبێ .. ئاگری
سەهۆڵ بم.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هیچم .. ناوێ
خۆشەویستی نەبێ

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ڕەشبین
و .. بە قین .. مەبە
دەردت .. لە قوتابی دەرمەکە
ئەوان .. خشتی دروستکردنتانن.

9/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەڵسەنگاندنی .. تۆ
بە داهاتووی .. قوتابییەکانت بەندە.

9/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

تەنیا
زانست بە بەخشینی
زۆرتر .. ئەبێ.

10/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـیٚ

ناو .. مێشکمان
ئاشکرا کەن.

1/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەنیشتاین ... خۆی ناساند
بەشێوازێکی زانینی تایبەت
زۆرانیش یارمەتیان دا
بۆ دروستکردنی نموونە
بۆ .. سوود وەرگرتنیان لە نموونە.

1/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مامۆستا ... مرد
هەموومان ببینە مامۆستا
مامۆستایی .. بۆ مامۆستا

1/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فرمێسکی ڕژاوم
تامم کرد و بۆنم کرد
ئاویکی سوێرە
بەهەشت لە کانیەکانی هەڵئەقوڵێ
لە دەریای ئاوی لەشمانە
دیارە لە دەریاوە هاتووین.

1/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خۆت دروستکەری ..
خۆت بە ..
بەو دیزاینەی .. ڕاسپێردراوی
بەو شتانەی ... دروستکراوی
بەو زانستانەی .. فێرکراوی
کەرەستەکان هی تۆیە
دەبێ دروستکردنیان هی تۆ بێ.

1/5/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

کەرەستەی دروستکردن
بەدروستکردنی جیاوازە
هەموویان (ئەلیکترۆن .. پرۆتۆن ..
نیوترۆن .. هتد ..)
خۆڵ .. هەوا .. ئاو.

1/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زانکۆی جیهان
ئەزهەری جیهانە.
لە زانکۆی جیهان سەد ساڵی تر .. و ..
سەد هەزار ڕووناکبیر.

10/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ڕاستەم ... لە دەست نەگرت
قوتابی .. پێ لێیبدەم .
بەڵکو .. هێلی ڕاستی پێ
بنەخشێنم

10/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مەهێڵن ... دەرگای خۆم
لەخۆم .. دابخەم.

27/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

کارکردن .. زانین ... ناسین .. سەرمایە
بە خۆشەویستی بیبەستی
وەستای .. وەستایەتییە.

27/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەربەدەری لە دەروون دایە
چ .. مرۆڤ بێت
چ .. وولات

27/4/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بەجێم مەهێڵن بە تەنیا
لەخۆم ... ئەترسم ..

27/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بە پێستی ... ڕەشەکان
دڵم سپی بوو
بە هی سپیەکان ...
ڕەش بوو.

27/4/2013
هەولێر



## مامۆستا ئەڵێ

سەنگەری .. نەزان
زۆر ... قووڵە
بۆ .. خۆی .. و دەوروبەری
خۆتان .. لێی بپارێزن.

27/4/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سنوری بلیمەت
سنوری زانستەکان
سنوری زانستەکان
سنوری گەلاکسیەکان
سنوری گەلاکسیەکان
سنوری ئەتۆمە.

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بەساقەی قوتابییان بم
چەند هانم ئەدەن
بۆ زانین.

12/5/2013

هەولێر ــ ماڵ




خەڵووز .. و .. ئەڵماس
هەردووك کاربۆنن
یەکیان ئەسوتێ .. ئەوی تر نـــا
خەڵوز .. بۆ پاراستنی گەرمای ژیانە
ئەڵماس ... بۆ پیشاندانی دەرامەت
ئێمەی مرۆڤــ ... لە ستراتیژیەتی
پێداویستی ژیان دەرچووین.

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەون .. ئاوێتەی شاردراوەی
ژیانی .. ڕابردووە.

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

دەربەدەری .. هێزی
نەشتەرگەری کۆمەڵە
لەناوەخۆ .. و ... لە دەرەوەی خۆ

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەی مرۆڤ .. ئەی بەستەزمان
هەموو ژیانت .. بە فێرۆیە.

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

زۆر گەورەمان کردی ..
هاربووی !
هاریت ئەمانکوژێ .. و
ئەتکوژێ.

12/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

سەیری .. ڕابردوو مەکە
بێ ئەمەکە.

12/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

گوڵی سروشتی بەهار
و .. گوڵی نایلۆنی بێ نیگار
یەکیان .. دەستکردی خودایە
ئەوی تریان هی مرۆڤـــــــــ

10/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

قرمزی شرابم
قره أولدی
زارم مزار اولدی
ئای الله
نایدی گۆناهم.

5/4/2011
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

به .. مردنم
ئاگری مردن ئەکوژێنمەوە
مردن له ژیانه
له مردنی .. مردن.

24/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بۆ ... سەروەری پیشەیان
مامۆستایان
هەم ... مامن
هەم ... وەستا

11/6/2012
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

تەلەفزیۆنی ماڵەوەم فرۆشت
دوو مانگی تری پێ بژیم
لەسالآنی برا کوژی
فێرکردنی قوتابیانم بەجێ نەهێشت
وەك مۆم سوتام
وەك تیشك مام.
بەجێم نەهێشت.

24/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بیر .. و .. بڕوا
پێشمەرگەی زانیین .. و .. زانستین
پێشمەرگەی دوا ڕۆژ
کۆماری کوردستانین
پێشمەرگایەتیمان
داهێنان .. و .. زانینە

د.نوزاد یحیی باجگر

9/11/2014
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەمووتان ... لەمن باشتربن.

25/3/2013

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من ڕاست بم
هەموو وڵات ڕاستە
من هەنگ بم
کوردستان گوڵستانە.

26/3/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

من ببم دەربەدەر
ئێوەش قوڕبەسەر.

26/3/2013

هەولێر ـ ئۆفیس



# مامۆستا ئەڵێ

خاکی ... دەروون
ئاوازی ... روح
سەربەستی ... ئاوات
خۆڵی دروستکردنی قوڕی کەرپوچی ژیانە.

14/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

قوتابیم ...
خۆزگە قوتابیەکان بیانزانیبایە
منیش وەك ئەوانم.

14/5/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مامۆستاکان یەکبگرن بەزانستی
پرۆسەی قوتابیان
چاغ داش .. بکەن
ئەگەر ... نا ... هەموو شتەکانم
دژی .. دژایەتیە.

14/5/2013
هەولێر – مال



# مامۆستا ئەڵێ

قوتابییەکانم ..
گەنجینەی زانست
چەندی .. لێی دەربهێنی
گەورە .. ئەبێ.

14/5/2013

هەولێر – مال



# مامۆستا ئەڵێ

خۆزگە .. بەو شتانەی کە وەك بەلەم
بە شەپۆل .. لافاو ... نوقم نابن
سوکترن .. لەئاو
ئەگەر ... ناتوانی بفڕی
نقوم .. مەبە
مەلە .. فێر بە.

14/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پەرژینی ... بەڕەڵایی
سنووری ... نیە
خەمخۆری .. نەزانینی
ئاگای لێ ... نیە.

14/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەر یەکێك ...
بەهرەیەکی هەیە
بیدۆزنەوە
گرنگی پێ بدەن
وە گەشەی پێ بکەن.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەرمایە .. عەقڵە
ئەوەی تری .. دۆزینەوەیە .

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

کات .. مەدە بۆ ڕابردوو
تەنیا بۆ ئێستا .. و .. داهاتوو.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت ... خاکە
نێر ... بارانە
خاك ... بێ باران
شین نابێ.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ئافرەت .. هێزە
ووزەیە ...

15/5/2013
هەولێر



## مامـۆستا ئەڵێ

سەربەستی .. و .. سەربەخۆیی
ئافرەت
ڕزگاریی ... ڕزگارییە.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

نەفرەت .. نیە ..
ئافرەت ... خۆشەویستی
ژیان و مان ...
پێکەوە ... ژیان.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

میللەت ...
مامۆستای .. هاوچەرخ ..
و.. سەربەستی نەبێ
دواکەوتووە.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بۆ ... ئافرەتان
ڕێز .. و .. دەست ماچ کردن
وەك دایك .. داپیران.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

سەنگی ... ئافرەت
لە پلاتین .. قورسترە.
لە هەوا سووکترە .. وەك فریشتە
ئەفڕێ .. و .. مەزنترە.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت .. مەزنترە
لە جوانی.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت ... خاوێنتره
له خاوێنی.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت .. بە لاوازی تێ ئەگەین
چونکە .. نایناسین.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت ... هەوێن .. و ..شیری
ماستی .. ژیانە.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

ژیری ... ئافرەت
دروستکردنی ژیانە.

15/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت
سامان .. دروستکەرە.

15/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

دایكم ... باشترین
مامۆستامە.

15/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

مامۆستای .. ئافرەت
مامۆستاترە.

**16/5/2013**
**هەولێر**



# مامۆستا ئەڵێ

ئافرەت .. سەنگی
ڕاگرتنی ... تەرازووی ژیانە

16/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پەری .. ئافرەتە.

16/5/2013

هەولێر



# مامـۆسـتا ئـەڵێ

هەڵسەنگاندنی .. ئافرەت
سەختترین .. هەڵسەنگاندنە.

16/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

خەرمانی .. ئافرەت
خەڵاتی .. خودایە.

16/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

بۆ خۆشەویستی .. ئافرەت
ئافرەت ناسینی .. ئەوێ

16/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لە .. دەروازەی ئافرەت
پیاو .. دەبێ
بزانێ چۆن کلیلەکەی
ئەدۆزێتەوە.

16/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەر دەرگایەك کلیلێکی هەیە
هەر ئافرەتێك .. ئەبێ کلیلی بۆ
دروست بکەی.

16/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

فرمێسکی .. ئافرەت
قورسترە ... بەهێزترە
لە ژان
زۆرترە .. لە باران
ڕووباری ئاوەدانی لێ ئەڕوێ.

16/5/2013
هەولێر



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

باوك ... باوكايەتی ئەڕوێنێ
هێز ئەچەسپێنێ
لە ژيانمان .. بۆ نەوەمان.

17/5/2013
هەولێر. ذكري وفاة الوالد العشرون




خودای گەورە ..

هێزی چەسپاندنی خوڵقاندن

بە .. باوك .. دایە.

نوزاد یحیی سعید باجگر

ساڵیادی کۆچی (کاکە حاجی یەحیا)ی بیستەم.

17/5/2013

هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

باوكمان ... مامۆستامانە
لەژیانی .. و .. پاش كۆچی.

نوزاد یحیی سعید باجگر
17/5/2013
هەولێر یادساڵی بیستەم- كۆچی بابی ئەزیزم.
ئێستاش ئامۆژگاریم دەكا.



# مامۆستا ئەڵێ

## باوکایەتی ... پیرۆزترین ئەرکە

نوزاد یحیی سعید
17/5/2013
کۆچی بابە حاجی یەحیا



# مامۆستا ئەڵێ

باوك
هەموو .. شت ئەبەخشێ
بە خۆشیەوە
قەبوڵی بەخشینی
بۆی بەختیاریە.

نوزاد يحيى سعيد
17/5/2013
هەولێر.ماڵ/ یادی بیستەم ساڵی کۆچی حاجی
یەحیا سعید خضر الیاس محمد



# مامۆستا ئەڵێ

باوکایەتی ... خۆشی دەروونی
خوڵقاندن .. و .. پەروەردەیە.

نوزاد يحيى سعيد
17/5/2013
هەولێر. بیست ساڵە بێ باوکم



# مامـۆستا ئەڵێ

چاوم .. تیشکی ڕووناکی ڕۆژ نابینێ
لە تاریکی فراوانی دەریای چاوانت
چاوەکانم .. بینینی ... لەبیرچوو..!

نوزاد یحیی سعید
18/5/2013



# مامۆستا ئەڵێ

## خۆزگەی زانین
## لە عاشق مەعشوقترە

نوزاد یحیی سعید
18/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

خەرمانی خۆشەویستی
لێی .. تێر ئەخوا
خاك ... خۆر ..مەل .. هەوا
خودا .. هەمووی .. ژیاندوون ..
و .. هەموو ... هەمووەكانی خودا.

نوزاد یحیی سعید
18/5/2013
هەولێر ـ ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

زانستەکانی ... عەشق
دەرگاکانی بەخۆشەویستی
بەخۆشی .. ئەکرێتەوە.

نوزاد یحیی سعید
18/5/2013
هەولێر ـ ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

عەشقی ژیانی ژیان
بەخۆشی
عاشقانی .. عاشقان
ئەبزوێنێ.

نوزاد يحيى سعيد
18/5/2013
هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عاشقی ژانی ژیان مەبە
عەبداڵی خۆشیەکەی بە.

نوزاد يحيى سعيد
18/5/2013
هەولێر



# مامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عاشقی .. بەڕەڵایی
دەربەدەری لەدووە
خۆشەویستی .. خۆیەتی
خۆشی لەدووە.

نوزاد يحيى سعيد
18/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

عەشقی .. مەعشوق
عەشقە
لەناوەندی بەهەشتە

نوزاد يحيى سعيد
19/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

مامۆستا .. فانۆس هەڵگرە
دەست بڵند .. سەر بەرزە.

نوزاد يحيى سعيد
19/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

ئەگەر ... تاکەکانی .. میللەت
ژیر .. و .. سەربەست .. و ... زانا بێ
ترسی .. دکتاتۆریەت نیە.

نوزاد یحیی سعید
19/5/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

تاك .. كەرپوچی
دروستكردنی ووڵاتە.

نوزاد يحيى سعيد
19/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

پەیوەندی .. تاکەکانی .. میللەت
چیمەنتۆی دروستکردنە.

نوزاد یحیی سعید
19/5/2013
هەولێر ـ ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

خەڵووز ... پەنگری کوژاوەیە
هەرکاتێك ... پەنگری لێ ئەخوڵقێ
بەدەنکە شقارتەیەك
پەنگری ڤۆلکانی لێ هەڵئەگیرسێ
شۆڕشی ڕوخاندن ...
و .. درووستکردنی .. ئەسووتێ.

نوزاد يحيى سعيد
20/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لە .. لای ئێمە
زانکۆ .. و .. فێربوون پێکەوە تەواون
لەلایان
فێربوون .. ئنجا زانکۆ.

نوزاد يحيى سعيد
20/5/2013



# مامـۆستا ئەڵێ

فێر .. بوون لە زگی دایکەوە
هەتا .. پاش مردنیش.

نوزاد يحيى سعيد
20/5/2013



# مامۆستا ئەڵێ

فێر .. بوون
هێزی پەیوەندییەکانی
خوڵقاندووە.

نوزاد یحیی سعید
20/5/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵێ

فێربوون ...
فێرکردن
وەك
پەیوەندیەکانی (ـ) .. و .. (+)
زائد .. و .. ناقصە
هەردووك ...
ئەبنە
هێڵی .. ئاسوودە.

نوزاد یحیی سعید
20/5/2013



# مامـۆستا ئەڵێ

فێرکردن ... هەرچەند .. بیبەخشی
زۆرتر .. ئەبێ.

نوزاد یحیی سعید
20/5/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

تۆ .. خودا .. مامۆستا
فێرم بکە چۆن ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم
ئەوەی بڕوای پێ ئەکەم بینوسم
بێ ئەوەی بترسم
مامۆستای مامۆستا ووتی
ئەو کاتە هەموو شت ئەبەخشی !
بەبێ .. ئەوەی بتەوێ.

11/6/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

ئەیدۆزمەوە
کەناترسم لە ونبوونی.
ونبوونی خۆم ئەدۆزمەوە
لەناو مەترسییەکانم.

11/6/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

لەناو شارستانیەتی .. تایم سکوێر
ئەخولێمەوە .. هەروەك بیابانی نوگرە
سلمان
ڕۆحی ناخی خۆم .. لێرە نابینم
ئەوانیش .. هەست بە شیرینی
ئاوی (دجلە) ناکەن
هەردوو .. لا.. حەقمانە.

11/6/2013
هەولێر



# مامـۆستـا ئـەڵـێ

مامۆســتا .. بە
یان .. مەبە

نوزاد يحيى سعيد
11/6/2013
هەولێر ـ ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

هەستی زانینی زانین
بەبێ هەستی .. مەغروریە.

نوزاد يحيى سعيد
11/6/2013
هەولێر ـ ماڵ



# مامۆستا ئەڵێ

ترس .. وەك خوێ
کەمی ... و... زۆری .. خەراپە.

نوزاد يحيى سعيد
11/6/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

هەندێك ترس
سەلامەتی ئەچەسپێنێ
زۆری
ژیان ئەڕوخێنێ.

نوزاد یحیی سعید
11/6/2013
هەولێر ــ ماڵ ـ دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

ترسی ... ترس
مەترسیە.

نوزاد يحيى سعيد
11/6/2013
هەولێر ــ ماڵ ـ دريم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

ترس .. و .. ئازایەتی
چاندنی .. کەسایەتی.

نوزاد یحیی سعید
11/6/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

شیرینی وولاٚتم
لەتام .. و .. بۆنی
شنەی بێ تامی .. و .. بێ بۆنی دێ.

نوزاد یحیی سعید
11/6/2013
هەولێر




وولاّتی .. شیرینم
سنوور .. ونم
سڕاوەم لەسەر نەخشەی دانراویان
بەڵام .. ئێمە لێرەین
خاوەن .. خاك .. کەلتوور .. ڕەوشت
با سنوور بکێشن بە دڵی خۆیان
ئێمە بێ سنوورین لەناوخۆمان.

نوزاد یحیی سعید
11/6/2013
هەولێر ـ ماڵ

# مامۆستا ئەڵێ

تەنیا .. میللەتین زمانمان قەدەغە کرا.
لەوانەی ڕزگارمان بوو
بووینە .. عەرەبی شاخ
بوینە تورکی ئەنەدۆڵ
فارسی بێ ناسناو
ئێمە لە کوردستان ماین
ئاسنمان ڕواند
هەتا ناسناومان
چەسپاند.

نوزاد یحیی سعید
11/6/2013
هەولێر ـ ماڵ دریم ستی



# مامۆستا ئەڵێ

پەیوەندیی ... بەرەڵاییەکان
دەردی بەستنی ... وڵات درووستکەرانە.

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان اوتيل ــ اربيل



# مامـۆستا ئەڵێ

تایبەتمەندیی .. جوگرافیای میللەتی کورد
پاسەوانی .. دوژمنی باپیرانە.

نوزاد یحیی سعید
16/6/2013
دیوان اوتیل ـ اربیل



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

حەسەن زیرەك
دۆڵ .. و .. زوڕنای کوردە.

نوزاد یحیی سعید
16/6/2013
دیوان اوتیل ـ اربیل



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

عبدالكريمی مدرس
پیرە مەگرونە.

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان-اوتيل-اربيل



# مامـۆستا ئەڵێ

دەسەڵاتی دەستبەسەر
خەرمانی خڕنووکە.

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان اوتيل ـ اربيل



# مامـۆستا ئەڵێ

بەبێ باڵ ئەفڕم
بۆ ئاسمان
بۆ ناو ڤۆلکان
بزانم چی هەیە
لەسەرەوە
لەبنەوە.

نوزاد یحیی سعید
16/6/2013
دیوان اوتیل ــ اربیل



# مامۆستا ئەڵێ

ئەستەنبۆڵ
لە تەقسیم .. دەرگای کردەوە
ئێمەش ئەبێ ...
عەقڵمان تەرخان
بکەینەوە.

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان اوتيل ــ اربيل



# مامۆستا ئەڵێ

سامان ... پارە نیە
ئاسان .. نیە
هەموو پێداویستیەکانی
ژیان نیە.

نوزاد یحیی سعید
16/6/2013
دیوان اوتیل ـ اربیل



# مامۆستا ئەڵێ

زیندان سەربەستیە
ئەگەر بە مێشکی ئازاد
تەرخانی نەکەن.

16/6/2013
دیوان اوتیل ــ اربيل



# مامۆستا ئەڵێ

سەربەستی زیندانە
ئەگەر سنووری نەزانی

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان اوتيل ــ اربيل



# مامۆستا ئەڵێ

سابات .. ڕەشماڵی بێ خاوەن
بزن .. و .. سەگی
لێ ناحەوێتەوە.

نوزاد يحيى سعيد
16/6/2013
ديوان اوتيل ــ اربيل



# مامۆستا ئەڵێ

بیر ... چوار لای بێ هێزیە... و
هەموو لایەنی دروستکردنی هێزە

30/6/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

بیر .. مێژووی چالاکی مێشکە.

30/6/2013

هەولێر



# مـامـۆسـتـا ئـەڵـێ

فکر ... خەرمانی دەسەڵاتەکانی
ژێرییە ...
نەویستەی دەسەڵاتە.

30/6/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

من ...
نەوزاد یحیی سەعید خدر ئیلیاس باجگر
هەولێری .. کوردستانی ... جیهانی
لە 1948_2_28 هەتا هەتایە...

30/6/2013
هەولێر



# مامۆستا ئەڵێ

هەولێر ... شارمە
وڵاتمە .. بەهەشتمە
کالسیوم .. و .. کاربۆنی .. لەشمە.

25/7/2013
هەولێر



# مامـۆستا ئەڵێ

خۆشەویستی
بچێنین
بۆ ئەوەی ئاشتی
بدوورینەوە.

1/8/2013
هەولێر



# ژیاننامـــه

## د. نەوزاد یەحیا سعید خدر ئەلیاس محەمەد باجگر

١) لە رۆژی ٢٨ شوباتی ساڵی ١٩٤٨ی زاینی لە هەولێر لە دایکبووە.
٢) باوکی یەحیا سەعید باجگرە و دایکی مەکییە ئەحمەد سەمەد سەعدوڵایە، سێ براو و چوار خوشکی هەیە.
٣) قۆناغی خوێندنی سەرەتایی لەقوتابخانەی فەیسەڵییە و دواتر لە ئەربیل ئولا ئیبن خەلەکان بە زمانی کوردی تەواوکردووە، مامۆستایان ناسح داود لە (حساب) بیرکاری و فوئاد موعەلیم لەوێنەکێشان یەکەمین مامۆستای ئە و قۆناغەی بوون.
٤) قۆناغی ناوەندی لە دواناوەندی هەولێر خوێندووە و مامۆستا(مەکی) یەکەمین مامۆستایی خوێندنی ناوەندییەتی.
٥) قۆناغی دواناوەندی، لە دواناوەندی هەولێر تەواوکردووە، مامۆستا خەلیل عەبدوڵلا یەکەمین مامۆستای ئەو قۆناغەی بوو.
٦) لەپایزی ساڵی ١٩٦٧ لەکۆلێژی پزیشکی ـ زانکۆی موسڵ وەردەگیرێت.
٧) ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات و دەبێتە پزیشك.
٨) ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ دەبێتە پزیشکی نیشتەجێ و پاشان سەرۆکی پزیشکانی نیشتەجێ.
٩) ئەندامی بەشداری یەکێتیی نووسەرانی کورد بووە لەبەغدا ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.

١٠) لەساڵی ١٩٧٥- ١٩٧٦ راژەی سەربازی ئیلزامی دەیگرێتەوە و لە شار و شارۆچکەکانی (زاخۆ، هەولێر، رواندز) وەك پزیشکی سەربازی دەست بەکاردەکات.
١١) ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ وەك پزیشك لەگوندو ئاواییەکانی ناوچەی گەلاڵە خۆشترین ساتەکانی ژیان بەسەردەبات.
١٢) وەك پزیشکی پسپۆری گشتیی لە مستەوسەفی سێتاقان لەهەولێر دادەمەزرێ.
١٣) دەبێتە پزیشکی ئێمرجنسی لەنەخۆشخانەی کۆماری لە هەولێر.
١٤) دەبێتە پزیشکی راهێنەر لە نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن و پاشان نۆرینگەی تایبەتی ئێواران دەکاتەوە.
١٥) یەکەمین سەنتەری نەشتەرگەری دڵ و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن لەکوردستان و لە هەولێر دادەمەزرێنێ، لەگەڵ د. ولید خالد لەنەخۆشخانەی جمهوری ساڵی ١٩٨٢.
١٦) لەوەزارەتی تەندروستییەوە دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی خوێندنی باڵا - کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدیین ١٩٨٣.
١٧) راهێنانی نەشتەرگەری دڵ وسیینگ لە - مدينة الطب - لەبەغدا ئەنجام دەدات لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا یوسف نعمان ساڵی ١٩٨٣ و لێکۆڵینەوە لە پسپۆری نەشتەرگەری دڵ و سینگ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٧ ، زانکۆی بەغدا – مدينة الطب، لە نهۆمی نۆیەم، چوار ساڵی لێکۆڵینەوەیی و راهێنان لەوێ تەواو دەکات.
١٨) دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە - مدينة الطب، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدا لەتشرینی یەکەم ساڵی ١٩٨٧ دبلۆمی باڵای نەشتەرگەری دل و سینگ و بۆڕییەکانی خوێن وەردەگرێت.

١٩) دەگەڕێتەوە شاری هەولێر وەك پزیشكی پسپۆری نەشتەرگەری دڵ وسینگ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی سەلاحەددین دەست بە كاردەبێت.
٢٠) وەك پزیشكی پسپۆر لە نەخۆشخانەی (رزگاری) لە هەولێر لە سالآنی ١٩٨٧ـ ١٩٨٨ دەست بەكار دەبێت.
٢١)ساڵی ١٩٨٨ دەگوازرێتەوە بۆ كۆلێژی پزیشكی زانكۆی موستەنسەرییە، نەخۆشخانەی یەرموك، عیادەی پزیشكی تایبەتی خۆی لە بەغدا شەقامی مشەجەر، باڵاخانەی باقر ئەلباقر دەكاتەوە هەتا ١٩٩٦.
٢٢) ساڵی ١٩٩٦ ئەچێ بۆ توركیا و مێرسین.
٢٣) پرۆسەی هونەری شێوەكاری لە خانوی تایبەتی ـ ژوری وێنەكێشانی خۆی لە كۆمەڵگای سولی لە لێواری دەریای ناوەست دەسپێكردوە.
لەبواری هونەری تەشكیلی(٢٢٠) تابلۆی هونەری تەشكیلی كێشاوە.
لەبواری شعریشدا چەندین شیعری ئازادی كوردی و عەرەبی نووسیوە.
٢٤) سالێ ٢٠٠٣ دەگەڕێتەوە زێدی باب و باپیران لە شاری هەولێر، چالاكییە خزمەتگوزاری و بازرگانی و زانین و زانستییەكانی پەرەپێدەدات، لە تەواوی شارەكانی كوردستان و عێراق دا چالاكانە خزمەتگوزارییە زانسستیی و بازرگانییەكانی گەشە دەكەن.
٢٥) بەشداری دەكات لە پڕۆسەی بوژاندنەوەی ئابوری و وە بە رهێنان لە كوردستان و عێراقدا.
٢٦) چەندین كۆمپانییای جیهانی لە دوبەی، مێرسین، عێراق، سریلانكا و بەریتانیا دادەمەزرێنێ.
٢٧) ساڵی ٢٠٠٧ زانكۆی جیهان ـ هەولێر دادەمەزرێنێ.
٢٨) سالی ٢٠٠٩ بانكی جیهان بۆ وەبەرهێنان لە عێراق دادەمەزرێنی.
٢٩) قوتابخانەی جیهان بۆ سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی دادەمەزرێنێ.

٣٠) سەرۆکی ئەنجومەنی جیهان ـ بۆ ئاوەدانکردنەوەیە.
٣١) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری جیهان ـ بۆ خزمەتگوزاری نەوتە.
٣٢) سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێری خێرخوازی حاجی یەحیایە.
٣٣) دامەزرێنەری ئێزگەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی جیهانە لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٨ .
٣٤) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ سلێمانییە لە ساڵی ٢٠١١.
٣٥) دامەزرێنەری زانکۆی جیهان ـ دهۆکە لەساڵی ٢٠١٣.
٣٦) دامەزرێنەری مەڵبەندی راوێژکاری و توێژینەوەی زانستیی و یاسایی جینۆسایدە.
٣٧) دامەزرێنەری یانەی وەرزشی جیهانە لەساڵی ٢٠١٠ .
٣٨) ئەندامی کۆمەڵەی جیهانییە بۆ نەشتەرگەری دڵ.
٣٩) ئەندامی کۆمەڵەی ئاسیاییە بۆ نەشتەرگەریی دڵ.
٤٠) ئەندامی ئەنجومەنی پزیشکان، رۆژنامە نووسان، ژووری بازرگانییە.
٤١) دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتیی گیانەوەرانە.
٤٢) دامەزرێنەری کۆمەڵەی پاراستنی ژینگەیە.
٤٣) خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری زانکۆی جیهانە.
٤٤) تا ئێستا دەیان کتێبی چاپکردووە، لەوانە: (ووشە دەچێنم، ازرع الكلمات ، في الله، الموت، پێشمەرگە، کوردستان لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا(١٠بەرگ)، الالبوم فن التشكيلي ، زنجیرە پەرتوکی مامۆستا ئەڵێ ...).
٤٥) چەندین کتێبی تازەی ئامادەی چاپە لەوانە (ئاشتی، ليلا، هزر ...).
٤٦)سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمینداریەتی زانکۆکانی جیهانە (هەولێر، سلێمانی، دهۆك).
٤٧) سە رۆکی ئە نجومە نی ئە میندارية تی زانکۆی (ئەربیلی نێودەوڵەتی)یە.

٤٨) دامەزرێنەری (ئەکادیمیای جیهان)ــە بۆ پەرەپێدان و فێرکردنی پیشەیی.
٤٩)کۆلێژی قەڵا بۆ دیراساتی ئاینی لە ساڵی ٢٠١٨ دادەمەزرێنێت.
٥٠) لە دامەزرێنەرانی یەکێتیی وەبەرهێنەرانی کوردستانە.
٥١) ئەندامی رێکخراوی ئاشتی جیهانییە، رۆژی (٢٠١٦/٦/١٤) دەبێتە باڵیۆزی ئاشتی جیهانی لە کۆنگرەی ئاشتی جیهانی کە لە تونس بەسترا.
٥٢) پرۆژە ئایندەییەکانی بریتین لەمانە:
١) دامەزراندنی تۆڕی زانکۆکانی نێودەوڵەتی (International Network of Universities) بە مەبەستی بوژاندنەوە و پەرەپێدانی زانست و زانیاری لە نێو گە لاندا.
٢) کردنەوەی زانکۆ لەشارە گەورەکانی عێراق و کوردستان.
٣) خوێندنی مافی منداڵان و ئافرەتان لەقوتابخانەو زانکۆکاندا.
٤) بڵاوکردنەوەی پرۆژەی نا بۆ توندووتیژی خێزان، ئافرەتان، منداڵان.
٥) دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری جیهان و پاشان کردنەوەی کۆلێژی پزیشکی و دەرمانسسازی و پەرستیارییە.

بڕوام وایە (تەنیا چارە ... زانین و کارە)

"The only solution is education"

پزیشکی ڕاوێژکارییە، هونەرمەندی تەشکیلییە، شاعیرو بزنسمانە.